ناوی کتێب : دیوانی حەلاج

وەرگێڕان : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

ناوەند : ئەکادیمیای زانستی کوردی

ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢٤



# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

## اللهُمَّ صَلِّ على سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ الوَصــفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحـبِهِ وَسَلِّمْ تَسليماً

**شێخ مەنصوری حەلاج یەکێکە لەو زاتانەی لە ئەدەبیات و عیرفان و خواناسیدا ناوێکی دیار و ناسـراوە ، خەڵکێکی زۆری بەخۆی سـەرسـامکردووە لە ڕێگەی دەربڕینە شـیعریەکانیەوە کە ماناکانیان زۆر لە ڕووکەشـــەکە قوڵترە ، لەم دیوانەدا هەوڵدراوە گرنگترین و بەناوبانگترین و زۆرترین شـــیعری حەلاج وەرگێڕانی بۆ بکرێت بۆ ئەوەی خوێنەری کورد بێبەش نەبێت لە شعرەکانی ئەم کەسایەتیە ، هیوادارم ئەم هەوڵ و کارە ببێتە جێی ڕەزامەندی خۆشەویستانم**

**هەژیر**

## شعری یەکەم : إن الحبيب الذي يرضيه سفک دمي

إِنَّ الحَبيبَ الَّذي يُرضيهِ سَفكُ دَمي

دَمي حَلالٌ لَهُ في الحِلِّ وَالحَرَمِ

ئەو خۆشەویستەی کە ڕازییە بە ڕژاندنی خوێنم

ئەوا خوێنی منی حەڵاڵ بێت لە حەڵاڵ و حەرامدا

إِن كانَ سَفكُ دَمي أَقصى مُرادِكُمُ

فَلا عَدَت نَظرَةٌ مِنكُم بِسَفكِ دَمي

ئەگەر ڕژاندنی خوێنی من هەموو مەبەستتانە

یەک ساتیش سڵ ناکەم کە خوێنم بڕێژن

وَاللَه لَو عَلِمَت روحي بِمَن عَلِقَت

قامَت عَلى رَأسِها فَضلاً عَنِ القَدَمِ

سوێند بە خودا ئەگەر ڕوحم بزانێ ئاڵودەی کێ بووە

بەسەر دەڕوات نەوەک بە پێ

يا لائِمي لا تَلُمني في هَواهُ فَلَو

عايَنتَ مِنهُ الَّذي عايَنتُ لَم تَلُمِ



ئەی ئەو کەسەی لۆمەم دەکەیت لۆمەم مەکە لە خۆشەویستی ئەو

ئەگەر وەک من ئەوەت بچەشتایە کە چەشتوومە لێیەوە لۆمەت نەدەکردم

يَطوفُ بِالبَيتِ قَومٌ لا بِجارِحَةٍ

بِاللَهِ طافوا فَأَغناهُم عَنِ الحَرَمِ

کەسانێک بە دەوری کەعبە دەسوڕێنەوە تەنها بە جەستە

کەسانێکیش بە دەوری خودادا بۆیە پێویستیان بە کەعبە نەما

ضحى الحَبيبُ بِنَفسٍ يَومَ عيدِهِمُ

وَالناسُ ضَحّوا بِمِثلِ الشاءِ وَالنِعَمِ

خۆشەویست بۆ خۆشویستراو خۆی کرد بە فیدا لە جەژنەکەیان

خەڵکیش بەهەمان شێوە بەرخ و مەڕیان کردە قۆچ

لِلناسِ حَجٌّ وَلي حَجٌّ إِلى سَكَني

تُهدي الأَضاحي وَأُهدي مُهجَتي وَدَمي

خەڵک حەج دەکەن و منیش حەجم هەیە بۆ مەنزڵگاکەم

ئەوان قوربانی دەبەخشن و منیش خوێن و ڕوحم

**شیعری دووهەم : و أي الأرض تخلو منک حتی**

**وَأَيُّ الأَرضِ تَخلو مِنكَ حَتّى**

**تَعالَوا يَطلُبونَكَ في السَماءِ**

**تَرباهُم يُنظُرونَ إِلَيكَ جَهراً**

**وَهُم لا يُبصِرونَ مِنَ العَماءِ**

**کام زەوی لە تۆ خاڵیە تا ئەوان لە ئاسمان داوات بکەن ئەی خودا**

**بە ئاشکرا وا دەرئەکەوێ سەیرت بکەن ، بەڵام لەتاو کوێریدا ناتبینن**

**شعری سێهەم : سكرت من المعنى الذي هو طيب**

**سكِرتُ مِنَ المَعنى الَّذي هُوَ طَيِّبُ**

**(سەرخۆش بووم بەو مانایەی کە جوانتر و شیاوترە)**

**وَلَكِن سُكري بِالمَحَبَّةِ أَعجَبُ**

**(سەرخۆشیم بە خۆشەویستی سەیروسەمەرە ترە )**

**وَما كُلُّ سَكرانٍ يُحَدُّ بِواجِبٍ**

**(هەموو سەرخۆشێک حەدی لەسەر جێبەجێ ناکرێ)**

**فَفي الحُبِّ سَكرانٌ وَلا يَتَأَدَّبُ**

**(لە خۆشەویستیدا سەرخۆش هەیە و ئەدەب نادرێ)**

**تَقومُ السُكارى عَن ثَمانينَ جَلدَةً**

**(سەرخۆشەکان هەشتا جەڵدەیان لێدەدرێت)**

**صَحاةَ وَسَكرانُ المَحَبَّةِ يُصلَبُ**

**(بە ئاگاییەوە و سەرخۆشی خۆشەویستی لەخاچ دەدرێ)**

**واتا : حەزرەتی حەلاج لیرەدا باس لە حاڵەتێکی ڕوحی دەکات کە کاتێک مورید دەکاتە حاڵەتی فەنا بەشـێوەیەک مەسـت و حەیران دەبێ کە وەک سـەرخۆشـێکی لێدێ (لێرەدا لە**

**دەستەواژەی تەصەوف خمر بەمانای عیشق دێ و ئەو کەسەی سەرخۆشە واتا عاشقە و وشەکە مەجازیە) ، لەکاتێکدا ئەوەی مەی دەخواتەوە هەشتا جەڵدەی لێدەدرێ بەڵام ئەوەی مەستی عیشقە لە خاچ دەدرێت وەک حەزرەتی حەلاج**

**واتا : بەو بادە و مەیە مەست بووم کە پاک و خاوێنە ، بەڵام بە بادە و مەی خۆشەویستی زۆر سەیرتر مەست بووم ، خۆ هەموو مەستێک لێی نادرێت ، لە خۆشەویستیدا مەستبوونێک هەیە کە لێدانی لەگەڵ نییە ، ئەوەی سەرخۆش و مەست ببێت هەشتا جەڵدە (قامچی) لێدەدرێت و هاوار دەکات ، بەڵام ئەوەی مەستی خۆشەویستی بێت لەخاچ دەدرێت**

## شیعری چوارەم: فلیتک تحلو و الحیاة مریرة

فَلَيتَكَ تَحلو وَالحَياةُ مَريرَةٌ

وَلَيتَكَ تَرضى وَالأَنامُ غِضابُ

وَلَيتَ الَّذي بَيني وَبَينَكَ عامِرٌ

وَبَيني وَبَينَ العالَمينَ خَرابُ

إِذا نِلتُ مِنكَ الوُدَّ فَالكُلُّ هَيِّنٌ

وَكُلُّ الَّذي فَوقَ التُرابِ تُرابِ

فَيا لَيتَ شُربي مِن وِدادِكَ صافِياً

وَشُربِيَ مِن ماءِ الفُراتِ سَرابُ

**خۆزگایە تۆ شیرین بیت ئیتر با دوونیا هەمووی تاڵ بێت**

**خۆزگایە تۆ ڕەزامەند بیت ، ئیتر با خەڵک تورە بن**

**خۆزگایە ئەوەی لەنێوان من و تۆدایە بە بونیادی بمێنێتەوە**

**جا بێباکم لەوەی کە نێوان من و هەردوو جیهانیان خاپوور و خامۆش بێت**

**ئەگەر لە تۆوە مەیلێکم بەدەست بکات ، ئەوا ئەوەی دەمێنیتەوە هیچ نییە**

**هەموو ئەوانەی بەسەر خاکدا تێدەپەڕن هەر دەبنەوە بە خاک**



**خۆزگایە ئەوەی لە لوتف و سۆزی تۆ دەیخۆمەوە ڕاستی و ڕوون بێت**

**و خواردنەوەم لە ئاوی فورات سەراب و خەیاڵ و وەهم بێت**

## شیعری پێنجەم : أریدک لا أریدک للثواب

أُريدُكَ لا أُريدُكَ لِلثَوابِ

وَلَكِن أُريدُكَ لِلعِقابِ

فَكُلُّ مَآرِبي قَد نِلتُ مِنها

سِوى مَلذوذِ وَجدي بِالعَذابِ

تۆم دەوێت بەڵام نەوەک بۆ ئەوەی پاداشتم بکەیت

بەڵکو تۆم دەوێت بۆ ئەوەی سزام بدەیت

هەموو مەبەستێکم پێی گەیشتم و دەستم کەوت

تەنها تام و چێژی وەجد و حاڵەکەم نەبێت بە سزادانت

**شیعری شەشەم : متى سهرت عيني لغيرک أو بكت**

**مَتى سَهِرَت عَيني لِغَيرِكَ أَو بَكَت**

**فَلا أُعطِيَت ما مُنِّيَت وَتَمَنَّتِ**

**وَإِن أَضمَرَت يَوماً سَواكَ فَلا رَعَت**

**رِياضَ المُنى مِن وَجنَتَيكَ وَجِنَّةِ**

**هەرکات چاوەکانم بە خەبەر مایەوە بۆ جگە لە تۆ یاخود گریا**

**ئەوا نە ئەوەم پێ دەدرێت کە ویستومە و نەش ئەوەی خواستومە**

**ئەگەریش ڕۆژێک لە دڵمدا جگە تۆ شوێنم بۆ کەسێکی تر کردەوە ئەوا**

**با مەرگ ڕێگە نەدات غەیری ڕوومەتەکانت ڕوومەتی تر ببینم**

## شیعری حەوتەم : لا تسأمن مقالتي يا صاح

لا تَسأَمَنَّ مَقالَتي يا صاحِ

وَاِقبَل نَصيحَةَ ناصِحٍ نَصّاحِ

ئەی گەنج تاقەتت نەچێت لە نوسینەکەم

و ئامۆژگاریەکەم وەربگرە وەک کەسێکی ئامۆژگاریکار

لَيسَ التَصُوُّفُ حيلَةً وَتَكَلُّفاً

وَتَقَشُّفاً وَتَواجُداً بِصِياحِ

تەصەوف بریتی نییە لە فێڵ و خۆ دەرخستن

گۆشەگیری نییە یاخود حاڵ لێهاتن بە قیژاندن

لَيسَ التَصَوُّفُ كِذبَةً وَفَتوَةَ

وَجَهالةً وَدُعابَةً بِمِزاحِ

تەصەوف درۆکردن و دەست بەربڵاوی نییە

نەزانی و گاڵتەو گەپ نییە

بَل عِفَّةٌ وَمُروؤَةٌ وَفتوَةٌ

وَقَناعَةٌ وَطَهارَةٌ بِصَلاحِ



بەڵکو پاکیزەیی وسەرفرازی و فەریادڕەسییە

ڕەزامەندبوونە و خۆ چاک کردنە

وَتُقى وَعِلمٌ وَاِقتِداٌ وَصَفا

وَرِضىً وَصِدقٍ وَوَفاً بِسَماحِ

گوێڕایەڵ بوون و فێربوون و شوێنکەوتن و خاوێنکردنەوەیە

ڕازیبوون و ڕاستگۆیەتی و وەفاداری و دڵفراوانیە

مَن قام فيهِ بِحَقِّهِ وَحُقوقِهِ

وَخَلا عَنِ الحَدَثانِ وَالأَشباحِ

هەرکەس حەقی خۆی بداتێ و جێبەجێی بکات

بەدووربێت لە وتی وتی و خێوەکان

مُتَيَقِّناً مُتَصَبِّراً مُتَشَمِّراً

مُستَمطِراً مُتَقَصِّدِ السُيّاحِ

یەقینی هەبێت و سەبر بگرێت و گەشبین بێت

ئارامی بگرێت و بەناو خەڵکدا گەشت بکات

مُتَعَزِّزاً مُتَحَرِّزاً مُتَواضِعاً

مُتَبَدِّلَ الأَشباحِ وَالأَرواحِ

به پايەبەرزى و خۆبەكەمزانين و بەخشين

بەبێ گوێدانە خێو و ڕووحەكان

تَتَشَعشَعُ الأَنوار مِن أَسرارِهِ

كَتَشَعشُعِ المِشكاةِ في المِصباحِ

ڕۆشنايى و ڕووناكى لە نهێنيەكانى بكەشێتەوە

وەک كەشانەوەى ڕووناكى ناو چرايەک

تاءُ التُقى صادُ الصَفا وَواوُ الوَفا

فاءُ الفُتُوَّةِ فَاِغتَنِم يا صاحِ

تائى تەقوا و صادى سەفا و واوى وەفا

فائى بەخشندەييە ، تەسەوف ئەمەيە ئەى كەنج

## شیعری هەشتەم : وكان فؤادي خاليا قبل حبكم

وَكانَ فُؤادي خالِياً قَبلَ حُبِّكُم

وَكانَ بِذِكرِ الخَلقِ يَلهو وَيَمزَحُ

**دڵ و هەناوم بەتاڵ بوو پێش ئەوەی ئێوەم خۆش بوێت**

**بە باسی بونەوەران کەیف و جۆشی بۆ دەهات**

فَلَمّا دَعا داعي هَواكُم أَجابَهُ

فَلَستُ أَراهُ عَن وِصالِكَ يَبرَحُ

**کاتێک یەکێک بانگەوازی بۆ خۆشویستنتان کرد دڵم بەدەمیەوە چوو**

**وای نابینم کە هەتا گەیشتن پێتان کۆڵ بدات**

فَإِن شِئتَ واصِلهُ وَإِن شِئتَ بِالجَفا

فَلَستُ أَرى قَلبي لِغَيرِكَ يَصلُحُ

**ئەگەر ویستت ئەوا بەردەوامی پێ بدە و ئەگەریش ویستت دەردەسەری و مەینەتی بابێت**

**وای نابینم دڵم بۆ جگە لە ئێوە بشێت و بگونجێت**

**شیعری نۆیەم : لقد أعجبني الوجد**

**لَقَد أَعجَبَني الوَجدُ          بِمَن أَهواهُ وَالفَقدُ**

**بە دڵمە ئەم حاڵ و دۆخە لە دۆزینەوە و ونکردنی ئەو کەسەی ئەویندراری دەکەم**

**فَلا بُعدٌ وَلا قُربٌ          وَلا وَصلٌ وَلا صَدُّ**

**نە دووری هەیە و نە نزیکی ، نە گەیشتن و نەش جیابوونەوە**

**وَلا فَوقٌ وَلا تَحتٌ          وَلا قَبلٌ وَلا بَعدُ**

**نە سەرەوە و نەش خوارەوە ، نە پێشتر و نە دواتر**

**وَلا عُرفٌ وَلا نُكرٌ          وَلا يَأسٌ وَلا وَعدُ**

**نە زانراو و نە نەناسراو ، نە بێهیوا بوون و نە بەجێهێنانی پەیمان**

**فَهَذا مُنتَهي سُؤلي          وَأَنتَ الواحِدُ الفَردُ**

**ئەوە هەموو داوا و ویستی منە و تۆش خۆت تاکێکی بێهاوتایت**

**شیعری دەیەم : عقد الخلائق في الإله عقائدا**

عَقَدَ الخَلائِقُ في الإِلَهِ عَقائِداً

وَأَنا اِعتَقَدتُ جَميعَ ما عَقَدوهُ

**بونەوەران چەندین بیروباوەڕیان دامەزراند بۆ باوەڕهێنان بە خودا**

**من باوەڕم بە هەموو ئەو باوەڕانەی ئەوان هێنا**

## شیعری یانزدەهەم: تعودت مس الضر حتى ألفته

تَعَوَّدتُ مَسَّ الضُرِّ حَتّى أَلِفتُهُ

وَأَسلَمَني حُسنُ العَزاءِ إِلى الصَبرِ

خۆم ڕاهێنا لەسەر توشبوون بە ناڕەحەتی و نەهامەتی هەتا پێی ڕاهاتم

ئەم دڵنەواییە منی گەیاند بە سەبر و ئارامگرتن

## شیعری دوانزدەهەم : طلبت المستقر بكل أرض

طَلَبتُ المُستَقَرَّ بِكُلِّ أَرضٍ

فَلَم أَرَ لي بِأَرضٍ مُستَقَرّا

**داوای جێگیربوون و مانەوەم لە هەموو خاک و زەویەکدا کرد**

**بەڵام بینیم لە هیچ زەویەک جێگیربوون و شوێنی مانەوەم بۆ نییە**

وَذُقتُ مِنَ الزَمانِ وَذاقَ مِنّي

وَجَدتُ مَذاقَهُ حُلواً وَمُرّا

**تامی سەردەمم چەشت و ئەویش منی چەشت**

**من تامی ئەوم کرد بە شیرینی و بە تاڵی**

أَطَعتُ مَطامِعي فَاِستَعبَدَتني

وَلَو أَنّي قَنَعتُ لَكُنتُ حُرّا

**گوێڕایەڵی حەز و چاوچنۆکیەکانم بووم هەتا کردمی بە کۆیلەی خۆی**

**ئەگەر بە بەشی خۆم ڕازی بوومایە ئێستا ئازاد دەبووم**

## شیعری سیانزدەهەم : العين تبصر من تهوى و تفقده

العَينُ تُبصِرُ مَن تَهوي وَتَفقِدُهُ

وَناظِرُ القَلبِ لا يَخلو مِنَ النَظَرِ

چاو دەکرێت ئەو کەسە ببینێت کە خۆشی دەوێت و دەکرێت ونی بکات

ئەوەشی بە دڵ دەبینێت ئەویش هەر بینینی هەیە

إِن كانَ لَيسَ مِعي فَالذِكرُ مِنهُ مَعي

يَراهُ قَلبي وَإِن قَد غابَ عَن بَصَري

ئەگەر ئەو لەگەڵ من نەبێت ئەوا یادی لە گەڵمە

دڵم دەیبێنێت ئەگەرچی لە چاوم ونبووبێت

## شیعری چواردەهەم : والله ما طلعت شمس و لا غربت

وَاللَه ما طَلَعَت شَمسٌ وَلا غَرُبَت

إِلّا وَحُبُّكَ مَقرونٌ بِأَنفاسي

سوێند بە خودا خۆر هەڵنەهاتووە و ئاوا نەبووە

هەتا هەردەم خۆشەویستی تۆ لەگەڵ هەناسەکانم نەبوبێت

وَلا جَلَستُ إِلى قَومٍ أُحَدِّثُهُم

إِلّا وَأَنتَ حَديثي بَينَ جُلّاسي

دانەنیشتووم لەناو خەڵکانێک کە قسەیان بۆ بکەم

هەردەم تۆ باس و خواسەکەم بیت لەناویاندا

وَلا ذَكَرتُكَ مَحزوناً وَلا فَرِحاً

إِلّا وَأَنت بِقَلبي بَينَ وِسواسي

هەرکات لە دڵتەنگی و لە خۆشحاڵیدا یادم کردبیت

هەردەم لە ناو دڵم دایت لەناو سینەمدا

وَلا هَمَمتُ بِشُربِ الماءِ مِن عَطَشٍ

إِلّا رَأَيتُ خَيالاً مِنكَ في الكَأسِ



هەرکات توینیم بوبێت و حەزم بۆ خواردنەوەی ئاو چووبێت

هەردەم وێنەیەکی تۆ لەناو پەرداخەکە دەبینمەوە

وَلَو قَدَرتُ عَلى الإِتيانِ جِئتُكُم

سَعياً عَلى الوَجهِ أَو مَشياً عَلى الرَأسِ

ئەگەر بمتوانیبایە بێمە خزمەتتان دەهاتم

بە ڕوو خشان یاخود بە ڕۆیشتن لەسەر سەر

وَيا فَتى الحَيِّ إِن غَنّيتَ لي طَرَباً

فَغَنّني واسِفاً مِن قَلبِكَ القاسي

ئەی گەنجی ئەم ناوچەیە ئەگەر شتێکم بۆ خوێندم

ئەوا بۆمی بخوێنە ، ئای بەداخەوە بۆ دڵی توندم

مالي وَلِلناسِ كَم يَلحونَني سَفَهاً

ديني لِنَفسي وَدينُ الناسِ لِلناسِ

چیم داوە لە خەڵک چەندە ئیلحاحم لێ دەکەن بەبێ مانا

ئاینی من بۆخۆم و ئاینی خەڵک بۆ خۆیان

## شیعری پانزدەهەم : یا عوضي من عوضي

یا عِوَضي مِن عَوَضي          وَصِحَّتي مِن مَرَضي

ئەی لەجیاتیەکەم لەجیاتی خۆم ، ئەی تەندروستیم لەکاتی نەخۆشیدا

یا مَن هَواهُ دائِماً          في مُهجَتي لا يَنقَضي

ئەی ئەو کەسەی حەز و خۆشەویستیەکەی هەمیشە ، لە دڵمدایە و لاناچێت

هَيَّمتَ قَلبي سَيِّدي          وَالقَلبُ بِالقُفلِ رَضي

دڵمت سەراوژێر کرد قوربان ، دڵیش بە داخستن ڕازی بوو

أَفنَيتَني أَضنَيتَني          قَلبي بِذِكراكَ رَضي

لە ناوت بردم ، ماندووت کردم ، دڵیش ڕەزامەندی دەربڕی بە یادکردنت

**شیعری شانزدەهەم : النفس بالشيء الممنع مولعه**

**النَفسُ بِالشَـيءِ المُمَنَّعِ مولَعَهُ**

**وَالحادِثاتُ أُصولُها مُتَفَرِّعَه**

**نەفس و خودی مرۆڤ هەمیشە حەزی بە شتی قەدەغەکراوە ، ڕووداوەکانیش بنچینەکانیان لقدارە**

**وَالنَفسُ لِلشَـيءِ البَعيدِ مُريدَةٌ**

**وَلِكُلِّ ما قَرُبَّت إِلَيهِ مُضَيِّعَه**

**نەفس و خودی مرۆڤ شتە دوورەکانی دەوێت ، هەر شتێکیش بە ئاسانی دەستی پێی بکات بزری دەکات**

**كُلٌّ يُحاوِلُ حيلَةً يَرجو بِها**

**دَفعَ المَضَرَّةَ وَاِجتِلابَ المَنفَعَه**

**هەمووان هەموو ڕێکارێک دەکرنە بەر دەیانەوێ بەهۆیەوە ، بەلایەک لابدەن و سودێکیان دەستکەوێت**

**شیعری حەڤدەهەم : إذا هجرت فمن لي**

إِذا هَجَرتَ فَمَن لي وَمَن يُجَمِّلُ كُلّي

وَمَن لِروحي وَراحي يا أَكثَري وَأَقَلّي

**ئەگەر تۆ بڕۆیت ئیتر کێ بۆم بمێنێتەوە ، کێ خەمخۆرم بێت ، کێ گرنگی بە ڕوح و ئارامیم بدات ئەی هەموو شتێکی من**

أَحبَّكَ البَعضُ مِنّي وَقَد ذَهَبتَ بِكُلّي

يا كُلَّ كُلّي فَكُن لي إِن لَم تَكُن لي فَمَن لي

**پارچە و بەشێک لە من تۆی خۆش ویست ، کەچی هەموو پارچە و بەشەکانمت برد ، ئەی هەموو شتێکی من بۆ من بە ، ئەگەر بۆ من نەبیت ئەی کێ بۆم بێت ؟**

يا كُلَّ كُلّي وَأَهلي عِندَ اِنقِطاعي وَذُلّي

ما لي سِوى الروحِ خُذها وَالروحُ جُهدُ المُقِلِّ

**ئەی هەموو شتێکم و هەموو کەسم ، لەکاتی دابڕان و شکستم ، تەنها ڕووحم ماوە ئەویش بە ، ڕوحیش بەقەد چاو تروکانێک ئاسانە**

**شیعری هەژدەهەم : أما والذي لدمي حللا**

أَما وَالَّذي لِدَمي حَلَّلا وَمَن خَصَّ أَهلَ الوَلا بِالبَلا

لَئِن ذُقتُ فيكَ كُؤوسَ الحِمام لَما قالَ قَلبي لِساقيهِ لا

**سوێند بەو کەسەی خوێنم بۆی حەڵاڵە ، و ئەو کەسەی وەفادارانی بە بەڵا تایبەتمەند کردووە**

**ئەگەر پیاڵەی شەرابی مەرگم پێ بچەشی ، هەرگیز دڵم بە ساقی ناڵێ نەخێر**

وَما كُنتُ مِمَّن تَشاكى الهَوى وَلَو قَدَّني مَفصَلاً مِفصَلا

رَضيتُ وَحَقِّكَ كُلَّ الرِضا ـِذا كانَ يُرضيكَ أَن أُقتَلا

**من لەوانە نیم کە گلەیی و گازندەیی بکەم ، تەنانەت ئەگەر پارچە پارچەم بە فیدات بکەن**

**ڕازیم سوێند بە تۆ بێ گومان ڕازیم ، ئەگەر ڕەزامەند بیت کە بکوژرێم**

فَلا عَيبَ إِن مِتُّ مَوتَ الكِرامِ كَما ماتَ في الحُبِّ مَن قَد خَلا

**عەیب نییە ئەگەر بە سەربەرزانە بمرم ، وەک چۆن ئەوانەی پێشتر لە پێناو خۆشەویستیدا مردوون**

## شيعرى نۆزدەهەم : ما يفعل العبد و الأقدار جارية

ما يَفعَلُ العَبدُ وَالأَقدارُ جارِيَةٌ

عَلَيهِ في كُلِّ حالٍ أَيُّها الرائي

أَلقاهُ في اليَمِّ مَكتوفاً وَقالَ لَهُ

إِيّاكَ إِيّاكَ أَن تَبتَلَّ بِالماءِ

بەندە چی بکات کە قەدەرەکان بەردەوام بن لە ڕوودان لە هەموو حاڵەتێکدا ئەی بینەری

من

منی خستە ناو دەریا بەبێ دەسەڵاتی و پێی وتم : هەرگیز و هەرگیز نەکەی تەڕ ببیت

**شیعری بیستەم : لبیک لبیک یا سري و نجوائي**

لَبَّيكَ لَبَيكَ يا سِرّي وَنَجوائي لَبَّيكَ لَبَّيكَ يا قَصدي وَمَعنائي

بەرەو ڕووت هاتم ، بەرەو ڕووت هاتم ، ئەی نهێنیەکەم و ئەی فەریادڕەسەکەم ، بەرەو ڕووت هاتم ، بەرەو ڕووت هاتم ، ئەی مەبەست و ڕووکەهی من

أَدعوكَ بَل أَنتَ تَدعوني إِلَيكَ فَهَل نادَيتُ إِيّاكَ أَم نادَيتَ إِيّائي

من داوات دەکەم یان تۆیت داوام لێ دەکەیت ؟ ئایا من تۆم بانگ کرد یان تۆ منت بانگ کردووە؟

يا عَينَ عَينِ وَجودي يا مدى هِمَمي يا مَنطِقي وَعَبارَتي وَإِيمائي

ئەی سەرمایەی هەبوونی من و هۆکاری ورە بەرزیم ، ئەی لۆژیک و دەستەواژە و ئاماژەی من

يا كُلَّ كُلّي وَيا سَمعي وَيا بَصَري يا جُملَتي وَتَباعيضي وَأَجزائي

ئەی هەموو شتێکم ، ئەی گوێ و چاوەکەم ، ئەی ڕستە و پارچە و بەشەکانم

يا كُلَّ كُلّي وَكُلُّ الكُلِّ مُلتَبِسٌ وَكُلُّ كُلِّكَ مَلبوسٌ بِمَعنائي

ئەی هەموو شتێکم ، هەموو شتێکیش بووە بە تۆ ، هەموو شتێکی تۆش دەورەی مانا و مەبەستەکانمی داوە

يا مَن بِهِ عَلِقَت روحي فَقَد تَلِفَت وَجداً فَصِرتُ رَهيناً تَحتَ أَهوائي

ئەی ئەو کەسەی ڕوحم پێی پەیوەند بووە ، ئەوە ڕوحم تێکچووە بە حاڵ و بووم بە بارمتەی حەز و ئارەزووەکانم

أَبكي عَلى شَجَني مِن فُرقَتي وَطَني          طَوعاً وَيُسعِدُني بِالنَوحِ أَعدائي

دەگریم بە کوڵ لەبەر دووریم لە وڵات و بە شیوەن دوژمنەکان دڵخۆشم دەکەن

أَدنو فَيُبعِدُني خَوفي فَيُقلِقُني          شَوقٌ تَمَكَّنَ في مَكنونِ أَحشائي

نزیک دەبمەوە بەڵام ترسەکەم دوورم دەخاتەوە بەمەش دودڵ دەبم لە پەرۆشبوونێک کە داخڵ بە ناو هەناوم بووە

فَكَيفَ أَصنَعُ في حُبٍّ كُلِّفتُ بِهِ          مَولايَ قَد مَلَّ مِن سُقمي أَطِبّائي

چی بکەم بە خۆشەویستیەک کە گەورەکەم داوای لێکردم پێی ، لە دەردەداریمدا پزیشکەکان تاقەتیان نەماوە

قالوا تَداوَ بِهِ فَقُلتُ لَهُم          يا قَومُ هَل يَتَداوى الداءُ بِالدائي

وتیان بەو خۆت چارەسەر بکە ، منیش وتم ئەی خەڵکینە ، ئایا دەرد بە دەرد چارەسەر دەبێ ؟

حُبّي لِمَولايَ أَضناني وَأَسقَمَني          فَكَيفَ أَشكو إِلى مَولايَ مَولائي

**خۆشەویستیم بۆ کەورەکەم پەکی خستم و نەخۆشی خستم ، ئیتر چۆن شکایەتی لای کەورەکەم بکەم کە کوێرِایەڵیم**

إنّي لَأَرمُقُهُ وَالقَلبُ يَعرِفُهُ                    فَما يُتَرجِمُ عَنهُ غَيرُ إيمائي

**من بەردەوام لێی دەڕوانم و دڵیش دەیناسێت ، ئەوەشی دەتوانم لەم حاڵە دەری ببڕم تەنها ئاماژەیە**

يا وَيحَ روحي وَمِن روحي فَوا أَسفي                    عَلَيَّ مِنّي فَإِنّي أَصِلُ بَلوائي

**وای لە ڕوحم ، ئای لە ڕوحم ، بەداخەوەم بۆ خۆم لە خۆم وا دەکەم بە بەڵا و ناڕەحەتیەکانم**

كَأَنَّني غَرِقٌ تَبدوا أَنامِلَهُ                    تَغَوُّثاً وَهوَ في بَحرٍ مِنَ الماءِ

**وەک خنکاوێکم کە پەنجەکانی دەرکەوتبێت و داوای فریادڕەسی بکات لەناو دەریایەک لە ئاودا**

وَلَيسَ يَعلَمُ ما لاقَيتُ مِن أَحَدٍ                    إِلّا الَّذي حَلَّ مِنّي في سُوَيدائي

**کەس نازانێت من چیم دۆزیەوەتەوە تەنها ئەوە نەبێت کە لەناو ئەم خەمە قوڵەمدا هەیە**

ذاكَ العَليمُ بِما لاقَيتُ مِن دَنَفٍ                    وَفي مَشيئَتِهِ مَوتي وَإِحيائي

**ئەو کەسەی دەزانێت کە چیم بەسەر هاتووە لە بێهێزی ، لە ویستی ئەویشە مردن و ژیانم**

يا غايَةَ السُؤلِ وَالمَأمولِ يا سَكَني          يا عَيشَ روحِيَ يا ديني وَدُنيائي

**ئەی هەموو مەبەست و ویستی من ئەی نیشتەجێبوو ، ئەی ژیانبەخش بە ڕووحم ئەی ئاین و دونیای من**

قُلي فَدَيتُكَ يا سَمعي وَيا بَصَري          لِم ذي اللُجاجَةُ في بُعدي وَإِقصائي

**پێم بڵێ – فەدات بم – ئەی بیسەر و بینەری من ، لە دووری و نزیکیمدا بەدەم پێداگریەکەم وەرە**

إِن كُنتَ بالغَيبِ عَن عَينَيَّ مُحتَجِباً          فَالقَلبُ يَرعاكَ في الإِبعادِ وَالنائي

**ئەگەرچی لەبەر چاوم ونبوویت و نابینرێیت ، بەڵام دڵم لەلاتە لە دووری و غەریبیمدا**

## شیعری بیست و یەکەم : طلعت شمس من أحب بليل

طَلَعَت شَمسُ مَن أُحِبُّ بِلَيلٍ فَاِستَنارَت فَما لَها مِن غُروبِ

إِنَّ شَمسَ النَهارِ تَغرُبُ بِاللَي لِ وَشَمسُ القُلوبِ لَيسَ تَغيبُ

مَن أَحَبَّ الحَبيب طارَ إِلَيهِ اِشتِياقاً إِلى لِقاءِ الحَبيبِ

**خۆری ئەو کەسـەی خۆشـم دەوێت دەرکەوت لە شـەودا ، ڕووناکی کردەوە هەموو شـتێک و ئاوابوونی بۆ نییە ، خۆری ڕۆژکار لە شـــەودا ئاوا دەبێت و خۆری دڵان هەرگیز ئاوا نابێت ، هەرکەس خۆشەویستێکی هەبێ بۆی دەفڕێت ، لەبەر تامەزرۆیی دیداری یارەکەی**

### شیعری بیست و دوو : الصب رب محب نواله منک عجب

الصُبُّ رَبِّ مُحِبُّ نَوالُهُ مِنكَ عُجبُ

عَذابُهُ عِندي عَذبٌ وَبُعدُهُ عَنكَ قُربُ

**خوای ئەم عەشقەی بەسەر من ڕژاندووتە لە خۆتەوە زۆر سەیرە ، ئەشكەنجەكەی لەلای من شرینە و دووریەكی لەتۆ نزیكییە**

وَأَنتَ عِندي كَروحي بَل أَنتَ مِنها أَحَبُّ

وَأَنت لِلعَينِ عِينٌ  وَأَنتَ لِلقَلبِ قَلبُ

حَسبي مِنَ الحُبِّ أَنّي لَما تُحِبّ أَحِبُّ

**تۆ لەلای من وەكو ڕووحمی بەڵكو لە ڕوحم خۆشەویستتری ، بۆ چاوم چاویت و بۆ دڵم دڵیت ، بەسیەتی لە خۆشەویستیدا كەوا ئەوەی تۆ خۆشت بوێت منیش خۆشم دەوێت**

**شیعری بیست و سێ : رأيت ربي بعين قلبي**

رَأَيتُ رَبّي بِعَينِ قَلبي فَقُلتُ مَن أَنتَ قالَ أَنتَ

فَلَيسَ لِلأَينِ مِنكَ أَينٌ وَلَيسَ أَينٌ بِحَيثُ أَنتَ

خودام بە چاوی دڵ بینی ، وتم تۆ کێیت ؟ وتی : تۆم ، شوێن و جێگەیەک بۆتۆ نییە و تۆش

لە شوێن و جێگەیەک نیت لەهەرکوێ بیت

وَلَيسَ لَلوَهمِ مِنكَ وَهمٌ فَيَعلَمُ الوَهمُ أَينَ أَنتَ

أَنتَ الَّذي حُزتَ كُلَّ أَينٍ بِنَحوِ لا أَينٍ فَأَينَ أَنتَ

خەیاڵیش ناتوانێ خەیاڵێکت بکات بە شێوەیەک کە بزانێت تۆ لەکوێیت ؟ تۆ ئەو زاتەی کە

هەموو شوێنت گرتووە بە شێوەیەک کە شوێنت نەبێ ئیتر تۆ لەکوێیت ؟

فَفي فَنائي فَنا فَنائي وَفي فَنائي وُجِدتَ أَنتَ

في مَحوِ اِسمي وَرَسمِ جِسمي سَأَلتُ عَنّي فَقُلتُ أَنتَ

لە نەمانمدا نەمانیشم چووە فەناوە ، لە فەنابوونیشم دا تۆم دۆزیەوە ، لە سڕینەوەی ناو و

شێوەی جەستەم ، کە پرسیارم لە خۆم کرد کە کێم ؟ وتم : تۆیت

أَشارُ سِرّي إِلَيكَ حَتّى فَنَيتُ عَنّي وَدُمتَ أَنتَ

أَنتَ حَياتي وَسِرُّ قَلبي فَحَيثُما كُنتُ كُنتَ أَنتَ

**نهێنی ڕوحم ئاماژەی بۆ تۆ کرد ، منی لەناوبرد و تەنها خۆت مایتەوە ، تۆ ژیانمیت و نهێنی دڵمیت ، لە هەرکوێ بم تۆ هەر لەوێیت**

أَحَطتَ عِلماً بِكُلِّ شَـيءٍ          فَكُلُّ شَـيءٍ أَراهُ أَنتَ

فَمُنَّ بِالعَفوِ يا إِلَهي          فَلَيسَ أَرجو سِواكَ أَنتَ

**زانستم لەسەر هەموو شتێک پەیدا کرد ، هەرچیەک ببینم هەر تۆیت ، لێبوردە ببە لەگەڵم ئەی خودایە ، هیچم مەبەست نییە جگە لە تۆ**

## شیعری بیست و چوار : اقتلوني يا ثقاتي

أَقتلوني يا ثِقاتي        إنَّ في قَتلي حَياتي

وَمَماتي في حَياتي        وَحَياتي في مَماتي

ئەی ئەو کەسانەی متمانەم پێتانە بمکوژن ، لە کوشتنی مندا ژیانم پێ دەبەخشنەوە ، مردنم لە ژیانمدایە و ژیانیشم لە مردنم

أنا عِندي مَحوُ ذاتي        مَن أَجَلَّ المَكرُماتِ

وَبَقائي في صِفاتي        مِن قَبيحِ السَيِّئاتِ

من ئەوەی هەمبێ ئەوەیە کە خۆم بەفەنا بردووە لەپێناو چاکە و بەخشندەیی خودا ، ئەوەی بمهێڵێتەوە ئاکار و کردەوە خراپەکانمە

سَئِمَت روحي حَياتي        في الرُسومِ البالِياتِ

فَاِقتُلوني وَاِحرِقوني        بِعِظامي الفانِياتِ

ڕوحم پڕوکا لە ژیانم ، حەز دەکا لێی دابپڕێت ، بمکوژن و بمسوتێنن ، بە ئێسکە لەناوچووەکانیشمەوە

ثُمَّ مُرّوا بِرُفاتي        في القُبورِ الدارِساتِ

تَجِدوا سِرَّ حَبيبي        في طَوايا الباقِياتِ

لاشه و ڕوفاتەکەم ببەن بەرەو گۆڕستان ، نهێنی دۆست و یارەکەم دەدۆزنەوە لەو خۆڵ و تۆزەی دەمێنێتەوە

إنيّ شَيخٌ كَبيرٌ          في عُلُوِّ الدارجاتِ

ثُمَّ إنّي صِرتُ طِفلاً          في حُجورِ المُرضِعاتِ

ساكِناً في لَحدٍ قَبرٍ          في أَراضٍ سَبِخاتِ

من کەسێکی بەتەمەنم لەوپەڕی پلەبەرزی ، پاشان دەبمە منداڵێک لە باوەشەکاندا شیرەخۆردەبم ، لەناو گۆڕێکدا دەمێنمەوە لە زەویەکی وشک و ڕەقدا

وَلَدَت أُمّي أَباها          إنَّ ذا من عَجَباتي

فَبَناتي بَعدَ أَن كُن          نَ بَناتي أَخَواتي

دایکم باوکی خۆی هێناوەتە دونیاوە ! ئەمەش لە سەیروسەمەرەکانی منە ، کچەکانم ئەگەرچی کچم بن بەڵام خوشکیشمن

لَيسَ مِن فِعلِ زَمانٍ          لا وَلا فِعلِ الزُناةِ

فَاجمَع الأَجزاء جَمعاً          مِن جُسومٍ نَيِّراتِ

ئەمە کات و سات وای لێنەکردووە ، نەخێر ، کردەوەی زیناکارانیش نییە ، بۆیە پارچەکان کۆبکەرەوە لە جەستەی گڕگرتووم

مِن هَواءٍ ثُمَّ نارِ        ثُمَّ مِن ماءٍ فراتِ

فَازرَعِ الكُلَّ بِأَرضٍ        تُربُها تُربُ مَواتِ

**له هەوا و له ئاگر ، پاشان له ئاوی فورات ، هەریەکەیان له خاکێک بچێنن که خۆڵەکەی وشک و بێ ڕووح بوبێت**

وَتَعاهَدها بِسَقيٍ        مِن كُؤوسٍ دائِراتِ

مِن جَوارٍ ساقِياتٍ        وَسَواقٍ جارِياتِ

فَإِذا أَتمَمتَ سَبعاً        أَنبَتَت كُلَّ نَباتِ

**و بەردەوام به له ئاودانی به سەتڵی ئاو ، له ئاوی ڕووبار و جۆگە و کانی ، ئەگەر حەوت جار ئەمەت کرد ، ئەوە باشترین ڕووەک دێنێتە بوونەوە**

### شیعری بیست و پێنجەم : لي حبيب أزور في الخلوات

لي حَبيبٌ أَزورُ في الخَلَواتِ        حاضِرٌ غائِبٌ عَنِ اللَحَظاتِ

ما تَراني أُصغي إِلَيهِ بِسِرّي        كَي أَعي ما يَقولُ مِن كَلِماتِ

خۆشەویستێکم هەیە کە لە خەڵوەتخانەکەمدا سەردانی دەکەم ، ئامادەیە و دیاریش نییە لەو

کاتانەدا ، نابینیت چۆن گوێی بۆ دەگرم بە دڵم تا بزانم چی دەفەرموێت ؟

كَلَماتٍ مِن غَيرِ شَكلٍ وَلا نَقـ        ـطٍ وَلا مِثلِ نَغمَةِ الأَصواتِ

فَكَأَنّي مُخاطِبٌ كُنتُ إِيّا        هُ عَلى خاطِري بِذاتي لِذاتي

فەرمایشێک بەبێ شێوە و وتن ، بەبێ تۆنی دەنگەکان ، وەک ئەوەی من قسەی لەگەڵ بکەم

لە ناخمەوە بە خودی خۆم بۆ خۆم قسە بکەم

حاضِرٌ غائِبٌ قَريبٌ بَعيدٌ        وَهوَ لَم تَحوِهِ رُسومُ الصِفاتِ

هُوَ أَدنى مِنَ الضَميرِ إِلى الوَهـ        ـمِ وَأَخفى مِن لائِحِ الخَطَراتِ

ئامادەیە و دیار نییە نزیکە و دوورە ، وێنەت سیفەتەکان ئەویان لەخۆ نەگرتووە ، ئەو لە دڵ

نزیکترە وەک لە خەیاڵ ، ونبووە لەوەی کە بە دڵدا دێت

## شیعری بیست و شەشەم : والله لو حلف العشاق أنهم

وَاللَهِ لَو حَلَفَ العُشّاقُ أَنَّهُم مَوتي مِنَ الحُبِّ أَو قَتلى لِما حَنَثوا

قَومٌ إِذا هُجِروا مِن بَعدِ ما وُصِلَوا ماتوا وَإِن عادَ وَصلٌ بَعدَهُ بُعِثوا

تَرى المُحِبّينَ صَرعى في دِيارِهِمُ كَفِتيَةِ الكَهفِ لا يَدرونَ كَم لَبِثوا

**سوێند بە خودا ئەگەر ئەوینداران سوێند بخۆن کە مردوون لە خۆشەویستیدا یاخود کوژراون ئەوا درۆیان نەکردووە ، خەڵکانێک کە ئەگەر دوای گەیشتنیان پێی بەجێ بهێڵدرێن دەمرن ، ئەگەریش دووبارە لێیان دەربکەوێتەوە زیندوو دەبنەوە ، ئەوینداران لە وڵات و شـاری خۆیان وەک بێئاگا دەبینیت ، وەک گەنجەکانی ناو ئەشـــکەوتن (ئەســـحابی کەهف) ، کە نەیاندەزانی چەند ڕۆژ لە ئەشکەوتەکە ماونەتەوە**

## شیعری بیست و حەوت : کفرت بدین الله والکفر واجب

كَفَرتُ بِدِينِ اللهِ وَالكُفرُ واجِبٌ    لَدَي وَعِندَ المُسلِمِينَ قَبِيحُ

**کوفرم کرد بە دینی خودا و کوفر لەسەر من پێویست و واجبە ، لەلای موسوڵمانانیش ناپەسەند و ناشرینە**

**تێبینی : لێرەدا کوفر واتا شاردنەوە ، حەلاجیش مەبەستی ئەوەیە کە ئەو عەشق و خۆشەویستی و خوداناسیەی هەیەتی دەیشارێتەوە و دەری نابڕێت لە ناو دڵی خۆی دەیهێڵێتەوە ، شێخی ئەکبەر موحیەدین ئیبن عەرەبی لەم شـــعرەی حەلاج دەفەرموێت : حەلاج ئەم شـــعرەی بۆ خوێندکارێکی نوسیوە و فەرموویەتی : سڵاوت لێبێت ڕۆڵەکەم ، خودا ڕووکەشی شەریعەتت لەبەرچاو ون بکات و ڕاستەقینەیی کوفرت نیشان بدات ، چونکە ڕووکەشی شەریعەت شیرکێکی شاراوەیە و ڕاستەقینەیی کوفر خوداناسیەکی گەورە و مەزنە ، بزانە کەوا خودا ئەگەر بیەوێت لە نوکی دەرزیەکیشدا خۆی نیشانی ئەو کەسە دەدات کە دەیەوێت ، مەبەست لەم نوسینە ئەوەیە کە وەســـیەتت بۆ دەکەم کە لوتبەرز نەبیت بە خوداوە ، لێی بێهیوا نەبیت ، پشـــت لە خۆشویستنی نەکەیت ، ڕازی مەبە بەوەی خودات خۆش نەوێت ، نە بوونی جێگیر بکە و نەش نەبوونی جێگیر بکە ، نەکەی هەرگیز نزیک بە تەوحید (یەکخواپەرستی) بکەویت !**

## شیعری بیست و هەشت : فما لي بعد بعدک بعدما

فَما لِيَ بَعدَ بُعدِكَ بَعدَما          تَيَقَّنتُ أَنَّ القُربَ وَالبُعدَ واحِدُ

وَإِنّي وَإِن أُهجِرتُ فَالهَجرُ صاحِبي          وَكَيفَ يَصِحُّ الهَجرُ وَالحُبُّ واحِدُ

لَكَ الحَمدُ في التَوفيقِ في بَعضِ خالِصٍ          لِعَبدٍ زَكِيٍّ ما لِغَيرِكَ ساجِدُ

**لەدوای دووری تۆ دووریەک بۆ من نییە دوای ئەوەی دڵنیا بوومەوە نزیکی و دووری یەکێکە ، من ئەگەر کۆچم کرد ئەوا کۆچ دەبێتە یار و یاوەرم ، کۆچکردن کەی دروســـتە ئەگەر خۆشـەویسـتی یەکێک بێت ، سـوپاس بۆ تۆ سـوپاسـێکی بێ پایان و ڕاسـتگۆیانە کە پشـتیوان و پەنای بۆ بەندەیەک کە بۆ جگە لە تۆ کڕنووشی بۆ کەس نەبردووە**

**شیعری بیست و نۆ : إلی کم أنت في بحر الخطایا**

إِلى كَم أَنتَ في بَحرِ الخَطايا		تُبارِزُ مَن يَراكَ وَلا تَراهُ

وَسَمتُكَ سمَتٌ ذي وَرَعٍ وَدينٍ		وَفِعلُكَ فِعلُ مُتَّبَعٍ هَواهُ

**هەتا چەنێک تۆ لە دەریای تاوان و بێفەرمانی کێشمەکێشم دەکەی لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەتبینێت و تۆ نایبینیت ؟ ، ڕوکەشت ڕوکەشی کەسێکی خاوەن هۆش و ئاینە ، کردەوەشت کردەوەی کەسێکە کە شوێن حەز و ئارەزووەکانی کەوتبێت**

فَيا مَن باتَ يَخلو بِالمَعاصي		وَعَينُ اللَهِ شاهِدَةٌ تَراهُ

أَتَطمَعُ أَن تَنالَ العَفوَ مِمَّن		عَصَيتَ وَأَنتَ لم تَطلُب رِضاهُ

**ئەی ئەو کەسەی کە لە چۆڵایی بێفەرمانیت دەکرد و خوداش بینەرت بوو و دەیبینیت ، دەتەوێ لێخۆشبوون بەدەست بهێنیت لەلایەن ئەو کەسەی بێفەرمانیت کردووە ، لەکاتێکدا تۆ داوای ڕەزامەندی ئەوت نەکردووە ؟**

أَتَفرَحُ بِالذُنوبِ وبالخطايا		وَتَنساهُ وَلا أَحَدٌ سِواهُ

فَتُب قَبلَ المَماتِ وَقَبلَ يَومٍ		يُلاقي العَبدُ ما كَسَبَت يَداهُ

**ئایا دڵخۆشـــیت بە ئەنجامدانی تاوان و بێفەرمانی و ئەو لەیاد دەکەیت نەک کەســـی تر ؟ ، بگەڕێرەوە پێس مردن و پێش ئەو ڕۆژەی کە بەندە ئەو کردەوانەی دەبینێتەوە کە ئەنجامی داون**

**شیعری سی : کتبت ولم أکتب إلیک و إنما**

**کَتَبتُ وَلَم أَکتُب إِلَیكَ وَإِنَّما		کَتَبتُ إِلى روحي بِغَیرِ کِتابِ**

**وَذَلِكَ أَنَّ الروحَ لا فَرقَ بَینَها		وَبَینَ مُحَبّیها بِفَصلِ خِطابِ**

**وَکُلُّ کِتابٍ صادِرٍ مِنكَ وارِدٌ		إِلَیكَ بِلا رَدِّ الجَوابِ جَوابي**

**نوســـیم بەڵام نوســـراوەکەم بۆ تۆ نەبوو ، بەڵکو بۆ ڕووحی خۆم بوو بەبێ هیچ نوســـراوێک ، ئەوەش چونکە ڕوحەکان جیاوازی لەنێوان ئەوان و دۆستەکانیان نییە هەرگیز ، هەر نوسراوێک لە تۆوە بێت ئەوا بۆت کەڕاوەتەوە بەبێ ئەوەی وەڵامێک لە منەوە هەبێت**

## شیعری سی و یەک : لا تلمني فاللوم مني بعيد

لا تَلُمني فَاللَومُ مِنّي بَعيدُ وَأَجِر سَيِّدي فَإِنّي وَحيدُ

إِنَّ في الوَعدِ وَعدكَ الحَقُّ حَقّاً إِنَ في البَدءِ بَدءَ أَمرى شِديدُ

مَن أَرادَ الكِتابَ هَذا خِطابي فَاِقرَؤوا وَاِعلَموا بِأَنّي شَهيدُ

لۆمەم مەکە چونکە لۆمەکردن لە منەوە دوورە ، دەســـتگیرم بە قوربان چونکە بێ کەســـم ،

بەڕاســتی بەڵێن و پەیمانی تۆ ڕاســتە ، لە ســەرەتای ئەم دۆخەدا ســەخت بوو حاڵ و دۆخم ،

هەرکەس کتێبەکەی ویست ئەمە وتەی منە ، بیخوێننەوە و بزانن کە من شەهید دەبم

**شیعری سی و دوو : قد تصبرت وهل يصبر**

قَد تَصَبَّرتُ وَهَل يَص بِرُ قَلبي عَن فُؤادي

مازجَت روحُكَ روحي في دُنُوّي وَبِعادي

فَأَنا أَنتَ كَما أَن نكَ أُنسـي وَمُرادي

**ئارامم گرت و ئایا دڵم دەتوانێت ئارام بگرێت لە جێی ڕوحم ؟ ڕوحی من و تۆ تێکەڵ بووە لە نزیکی و دووریمدا ، من تۆم وەک چۆن تۆ مایەی ئارامیبەخشی و ویست و داواکاری منیت**

**شیعری سی و سێ : أنتم ملكتم فؤادي**

**أَنتُم مَلَكتُم فُؤادي فَهِمتُ في كُلِّ وادِ**

**رُدّوا عَلَيَّ فُؤادي فَقَد عَدِمتُ رُقادي**

**أَنا غَريبٌ وَحيدٌ بِكُم يَطولُ اِنفِرادي**

**ئێوە دڵی منتـان داگیر کرد ، هەر بۆیە کەوتمە نـاو هەموو دۆڵێکەوە ، دڵم بۆ بگەڕێننەوە ئۆقرە و ئارامیم نەماوە ، من کەسـێکی نەناسـراوی بێکەسـم ، بە ئێوەوە تاک و تەنهاییم زیاتر درێژە دەکێشێت**

**شیعری سی و چوار : عقد النبوة مصباح من النور**

**عَقدُ النُبُوَّةِ مِصباحٌ مِنَ النورِ مُعَلَّقُ الوَحيِ في مِشكاةِ تَأمورِ**

**بِاللَهِ يَنفُخُ نَفخَ الروحِ في خَلَدي لِخاطِري نَفخَ إِسرافيلَ في الصورِ**

**إِذا تَجَلّى بِطَوري أَن يُكَلِّمَني رَأَيتُ في غَيبَتي موسى عَلى الطورِ**

**پەیمانی پێغەمبەرایەتی چرایەکە لە ڕۆشانیی کە پەیام دابەزێنەری بەستۆتەوە بە چرای دڵ ، با لە پێناو خودا فوو لە ڕوحی ناو جەستەم بکرێت ، لەبەر خاتری من ئیسرافیل ئەو فووە بکات ، ئەگەر هاتوو هاتە ســـەری کێوی طوری من تا ئاخاوتنم لەگەڵ بکات ، لەکاتێک لەویٚ نەبووم بینیم موسا لەسەر کێوی طورە**

**شیعری سی و پێنج : من سارروه فأبدى كل ما ستروا**

مَن سارَروهُ فَأَبدى كُلَّ ما سَتَروا　　وَلَم يُراعِ اِتِصالاً كانَ غَشّاشا

إِذا النُفوسُ أَذاعَت سِرَّ ما عَلِمَت　　فَكُلُّ ما حَمَلَت مِن عَقلِها حاشا

مَن لَم يَصُن سِرَّ مَولاهُ وَسَيِّدَهُ　　لَم يَأَمَنوهُ عَلى الأَسرارِ ما عاشا

هەرکەس نهێنی پێ بڵێن و بیدرکێنێت ئەوەی دایانپۆشـــیوە و ڕەچاوی ئەو پەیوەندیە پڕ متمانەیە نەکات کە لەنێوانیانداییە ئەوا فێڵزانە ، ئەگەر ناخەکان ئەو نهێنیە بدرکێنن کە دەیزانن ئەوا ئەوەی لە عەقڵ و هزریان بۆیان دەمێنێتەوە تەنها حاشـــاکردنە لەوەی وتویانە ، هەرکەس نەتوانێت نهێنی گەورە و ڕابەرەکەی بپارێزێت ، ئەوا نهێنی پێ نادەن هەتاکوو ماوە

وَعاقَبوهُ عَلى ماكَن مِن زَلَلٍ　　وَأَبدَلوهُ مَكانَ الأُنسِ إِيحاشا

وَجانَبوهُ فَلَم يُصلِح لِقُربِهِم　　لَمّا رَأَوهُ عَلى الأَسرارِ نَبّاشا

مَن أَطلَعوهُ عَلى سِرٍّ فَنَمَّ بِهِ　　فَذاكَ مِثلِيَ بَينَ الناسَ قَد طاشا

سزای دەدەن لەسەر ئەوەی درکاندویەتی و دەیخەنە شوێنی جانەوەرەکان لە بری مرۆڤەکان ، ئەگەر تەنانەت بیهێننە نزیک خۆشیان سودی نابێت کاتێک ببینن کەسێکە کە نهێنیەکان دەدرکێنێت و هەڵیدەداتەوە ، هەرکەسێک نهێنی پێ بڵێن و بیدرکێنێت ئەوا ئەو کەسە وەک منە لەناو خەڵکدا بە گومڕا لە قەڵەم دەدرێت

هُم أَهلُ سِرٍّ وَلِلأَسرارِ قَد خُلِقوا لا يَصبِرونَ عَلى مَن كانَ فَحّاشا

لا يَقبَلونَ مُذيعاً في مَجالِسِهِم وَلا يُحِبّونَ سَتراً كانَ وَشواشا

لا يَصطَفونَ مُذيعاً في مَجالِسِهِم حاشا جَلالُهُم مِن ذَلِكُم حاشا

فَكُن لَهُم وَبِهِم في كُلِّ نائِبَةٍ إِلَيهِم ما بَقى ذا الدَهرُ هَشّاشا

**ئەوان خاوەنی نهێنیەکانن و لە پێناو ئەو نهێنیانە دروست بوون ، ئارام ناگرن لەسەر کەسانێک کە نهێنیەکان بدرکێنن ، قبوڵی ناکەن کەسێک لە کۆڕ و کۆبونەوەیان شتەکان بدرکێنێت ، و حەزیان بە داپۆشینێکیش نییە کە دواتر بدرکێنرێت ، کەسێک هەڵنابژێرن بۆ کۆڕ و کۆبونەوەکەیان کە شتەکان بدرکێنێت حاشا لەو زاتە پایەبەرزانە کەوا بکەن حاشا ، بۆیە بۆ ئەوان ببە و کوێڕایەڵیان ببە هەموو کاتێک هەتا دونیا دونیایە**

**شیعری سی و شەش : یا نسیم الریح قولي للرشا**

| | |
|---|---|
| يا نَسيمَ الريح قولي لِلرَشا | لَم يَزِدني الوِردُ إلا عَطشا |
| لي حَبيبٌ حُبُّهُ وَسطَ الحَشا | إِن يَشَأ يَمشي عَلى خَدّي مَشى |
| روحُهُ روحي وَروحي روحُهُ | إِن يَشَأ شِئتُ وَإِن شِئتُ يَشا |

ئەی شـــنەبا ڕایبگەیەنە پێیـان و بیڵێ ، کەوا ئەو ویرد و زیکرەی دەیخوێنم زیـاتر و زیاتر تینووی کردووم ، خۆشــەویســتێکم هەیە کە خۆشــەویســتیەکەی لەناخمدا چەســپاوە ، ئەگەر بیەوێت بەسـەر ڕوومەتم دەڕوات و تێدەپەڕێت ، ڕوحی ڕوحمە و ڕوحم ڕووحی ئەوە ، ئەوەی ئەو بیەوێت من دەمەوێت و ئەوەی من بمەوێت ئەو دەیەوێت

**شیعری سی و حەوت : عجبت لكلي كيف يحمله بعضي**

**عَجِبتُ لِكِلَّيَ كَيفَ يَحمِلُهُ بَعضي**

**وَمِن ثِقلِ بَعضي لَيسَ تَحمِلُني أَرضي**

**لَئِن كانَ في بَسطٍ مِنَ الأَرضِ مَضجَعُ**

**فَقَلبي عَلى بَسطٍ مِنَ الخَلَقِ في قَبضِ**

**سەیرم لە هەموو جەستەم دێت کەوا چۆن دڵم توانیویەتی هەڵیان بگرێت ، و دڵیشم کە پارچە و بەشـێکی جەسـتەمە ئەوەندە قورس بووە پێم سـەیرە چۆن زەوی دەتوانێت هەڵی بگرێت ، ئەگەر لە فراوانی ڕووی زەویدا شــوێنێکم بۆ هەبێت ، ئەوا دڵم بە فراوانی ڕووی زەوی بۆ خۆشەویستی خودا کراوەیە و بە ئەندازەی مشتێکە لەبەرامبەر بونەوەراندا**

## شیعری سی و هەشت : أنا من أهوى و من أهوى أنا

أَنا مَن أَهوى وَمَن أَهوى أَنا نَحنُ روحانِ حَلَنا بَدَنا

نَحنُ مُذكُنّا عَلى عَهدِ الهَوى تُضرَبُ الأَمثالُ لِلناسِ بِنا

فَإِذا أَبصَرتَني أَبصَرتَهُ وَإِذا أَبصَرتَهُ أَبصَرتَنا

أَيُّها السائِلُ عَن قِصَّتِنا لَو تَرانا لَم تُفَرِّق بَينَنا

روحُهُ روحي وَروحي روحُهُ مَن رَأى روحَينِ حَلَّت بَدَنا

**ئەوە منم کە حەز و ئارەزووم هەیە و حەز و ئارەزووەکەشم هەر خۆمم ، ئێمە دوو ڕووحین کە لەیەک جەستەداین ، ئێمە لەو سەردەمەوەی کە پەیمانی حەز و ئارەزوو بەیەکەوەی بەستووین ، لەناو خەڵکدا وەک نمونە ئێمە باس دەکرێین ، ئەگەر من ببینی ئەوا ئەو دەبینیت ، ئەگەریش ئەو ببینیت ئەوا هەردووکمان دەبینیت ، ئەی ئەو کەســەی پرســیار لە چیرۆکی ئێمە دەکەیت ، ئەگەر ئێمە ببینیت نـاتوانیت جیاوازی لەنێوان هەردووکمـان بکەیـت ، ڕوحی ئەو ڕوحمە و ڕوحی منیش ڕووحی ئەوە ، کێ هەیە بینیبێتی دوو ڕووح لە جەستەیەکدا بن ؟**

## شیعری سی و نۆ : قلوب العاشقين لها عيون

قُلوبُ العاشِقينَ لَها عُيونٌ   تَرى ما لا يَراهُ الناظِرونا

وَأَلسِنَةٌ بِأَسرارٍ تُناجي   تَغيبُ عَنِ الكِرامِ الكاتِبينا

وَأَجنِحَةٌ تَطيرُ بغَيرِ ريشٍ   إلى مَلَكوتِ رِبِّ العالِمينا

**دڵی عاشـقان جۆره چاوێکی هه‌یه که شـتانێک ده‌بینێت که خه‌ڵک به چاویان نایبینن ، و دڵی عاشقان زمانێکی هه‌یه که پڕه له نهێنی و ئه‌وانه‌ی قسه ده‌نوسنه‌وه ناتوانن ئه‌و زمانه ببیستن ، دڵی عاشقان باڵێکی هه‌یه که ده‌فڕێت به‌بێ په‌ڕ بۆ ناو ده‌سه‌ڵاتی خودای گه‌وره**

وَتَرتَعُ في رِياضِ القُدسِ طَوراً   وَتَشرَبُ مِن بِحارِ العارِفينا

فَأَورَثَنا الشَرابُ عُلومَ غَيبٍ   تَشِفُّ عَلى عُلومِ الأَقدَمينا

شَواهِدُها عَلَيها ناطِقاتٌ   تُبَطِّلُ كُلَّ دَعوى المُدَّعينا

عِبادٌ أَخلَصوا في السِرِّ حَتّى   دَنَوا مِنهُ وَصاروا واصِلينا

**دڵی عاشقان له مێرگی پیرۆزیی کێوی طور ده‌نیشێته‌وه و له ده‌ریای خوداناسان ده‌خواته‌وه ، دڵی عاشـقان ئه‌وانه‌ی ده‌یبینن به‌هۆیه‌وه دێنه قسـه و به‌و قسـه‌یه هه‌موو بانگه‌شـه پڕوپوچه‌کان به‌تاڵ ده‌که‌نه‌وه ، عاشقان کۆمه‌ڵه به‌نده‌یه‌کن که ڕاستگۆ بوون له پاراستنی نهێنی خودا هه‌تاکو لێی نزیک بوونه‌وه و گه‌یشتن به‌و**

**شیعری چل : یا بدیع الدل و الغنج**

| | |
|---|---|
| يا بَديعَ الدَلِّ وَالغُنجِ | لَكَ سُلطانٌ عَلى المُهَجِ |
| إِنَّ بَيتاً أَنتَ ساكِنُهُ | غَيرُ مُحتاجٍ إِلى السُرُجِ |
| وَجهُكَ المَأمولُ حُجَّتُنا | يَومَ يَأتي الناسُ بِالحجَجِ |

**ئەی بەدیهێنەری شــتە جوان و دڵڕفێن و ســەرنجڕاكێشــەكان ، كە تۆ زاڵیت بەســەر هەموو شتێكدا و دەسەڵاتت بەسەریدا هەیە ، هەر ماڵێک تۆی تێدا بیت پێویستی بە چرا و ڕووناكی نییە ، ڕووی ڕەزامەندی تۆ بەڵگەمانە ئەو ڕۆژەی خەڵک لە مەیدانی مەحشــەر بەڵگەكانی خۆیان دەهێنن**

**شیعری چل و یەک : سقوني و قالوا لا تغن ولا سقوا**

**سَقَوني وَقالوا لا تُغَنَّ وَلا سَقَوا**

**جِبالَ حُنَينٍ ما سُقتُ لَغَنَّتِ**

**تَمَنَّت سُلَيمى أَن أَموتَ بِحُبَّها**

**وَأَسهَلُ شَيءٍ عِندَنا ما تَمَنَّتِ**

**جامێک لە شـــەرابی عەشـــقیان پێ دام و داوایان کرد کە گۆرانی و ئاواز نەڵێم ، ئەگەر ئەو شـــەرابەیان بدایە بە شـــاخەکانی حونەین ئەوا دەســـتی دەکرد بە گۆرانی و ئاواز ، ســـولەیما (وادیارە ناوی کەســـێک بێت ، هەندێک ســـەرچاوەش دەڵێن مەبەســـت لێی ڕووحە) ئاواتی خواست کە لە خۆشەویستی ئەودا بمرم ، ئاسانترین شتیش ئەوەیە کە ئەو ئاواتی پێ خواستووە**

## شیعری چل و دوو : لا كنت إن كنت أدري

لا كُنتُ إِن كَنتُ أَدري

كَيفَ السَبيلُ إِلَيكا

أَفَنَيتَني عَن جَميعي

فَصِرتُ أَبكي عَلَيكا

**با بوونم نەبێت و نەمێنم ئەگەر هاتوو بزانم ڕێگای بەرەو تۆ ڕۆیشتن کامەیە ، بەشێوەیەک منت**

**بردە ناو فەنا و لەناوچوونی هەموو شتێکم کەوا خۆم نەمام و بۆ تۆ دەگریم و گریانەکەم بۆتۆیە**

## شیعری چل و سێ : فیک معنی یدعو النفوس إليكا

فيكَ مَعنى يَدعو النُفوسَ إِلَيكا

وَدَليلٌ يَدُلُّ مِنكَ عَلَيكا

لِيَ قَلبٌ لَهُ إِلَيكَ عُيونٌ

ناظِراتٌ وَكُلُّهُ في يَدَيكا

**مانایەک لە تۆدا هەیە کە ناخ و کەسەکان بەرەو تۆ ڕادەکێشێت ، بەڵگەیەک لە خۆتەوە هاتووە کە نیشـــاندەرە بۆ خۆت ، دڵێکم هەیە کە چاوەکانی بۆ تۆ دەڕوانێـت ، ئەو دڵ و چاوەم هەمووی لە دەستی قودرەت و توانای تۆدایە**

## شیعری چل و چوار : لست بالتوحید ألهو

لَستُ بِالتَوحيدِ أَلهو

غَيرَ أَنّي عَنهُ أَسهو

كَيفَ أَسهو كَيفَ أَلهو

وَصَحيحٌ أَنَّني هو

**من گاڵتە بە یەکخواپەرســـتی ناکەم و بەکەمی نازانم ، تەنها ئەوەنەبێت کە لەوانەیە لەیادم بچێت ، جا چۆن گاڵتەی پێ بکەم و چۆن لەیادم بچێت کە من وەها چومەتە فەناوە بوومە بە ئەو و بوونێک بۆ خۆم نەماوە و هەموو شتێکم بووە بە ئەو**

## شیعری چل و پێنج : أأنت أم أنا هذا في إلهين

أَأَنتَ أَم أَنا هَذا في إِلَهَينِ — حاشاكَ حاشاكَ مِن إِثباتِ اِثنَينِ

هُوِيَّةٌ لَكَ في لائِيَّتي أَبَداً — كُلّي عَلى الكُلِّ تَلبيسُ بِوَجهَينِ

فَأَينَ ذاتُكَ عَنّي حَيثُ كُنتُ أَرى — فَقَد تَبَيَّنَ ذاتي حَيثُ لا أَيني

فَأَينَ وَجهُكَ مَقصوداً بِناظِرَتي — في باطِنِ القَلبِ أَم في ناظِرِ العَينِ

بَيني وَبَينَكَ إِنِيٌّ يُنازِعُني — فَارفَع بِلُطفِكَ إِنِيِّ مِنَ البَينِ

**ئەوە چیە کە خەڵک دەیڵێن ئەی خودایە ؟ گوایە تۆیت یان منم و هەردووکمان خوداین ؟ حاشـــا حاشـــا کە دووان بین ، کە من دەڵێم (لا اله الا الله) ، هەتا لا اله منم و الا الله تۆی ، هەموو بوونم لە بەرامبەر بوونت دا بوون نییە چونکە من سـەرەتا و کۆتاییم هەیە ، ئایا زاتی تۆ لەکوێی کاتێک من دەمڕوانی بۆ ئەوەی بتبینم ، خۆمم دیەوە کاتێک شوێنێکم بۆ نەما ، ڕووی ڕەزامەندی تۆ مەبەســتی تێڕوانینی من بوو لە قوڵایی دڵەوە بێت یاخود لە تێڕوانینی چاوەوە بێت ، لە نێوان من و تۆدا ، ئەو منە لابدە لەم نێوانەدا و تەنها تۆ بهێڵەرەوە**

**شیعری چل و شەش : أنا أنت بلا شک**

أَنا أَنتَ بِلا شَكٍّ فَسُبحانُكَ سُبحاني

وَتَوحيدُكَ تَوحيدي وَعِصيانُكَ عِصياني

وَإِسخاطُكَ إِسخاطي وَغُفرانُكَ غُفراني

**من تۆم بەبێ شک و گومان ، گەورەیی و شکۆمەندی بۆتۆ و بۆ من ، یەکتاپەرستی تۆ هی منە و بێفەرمانیکردنی تۆ بێفەرمانیکردنی منە و سـزای تۆ سـزای منە و لێبوردەیی تۆ لێبوردەیی منە (تێبینی : حەلاج لێرەدا دەکاتە حاڵەتی وەحدەتی وجود (یەکبوون) کە تێیدا حاڵەتێکە مورید یان حاڵدار دەبینێت کە دەکاتە حەقیقەتی ئەو حەدیســـەی دەفەرموێت : ( من عرف نفسـە عرف ربە) ، واتا هەرکەس خۆی بناسێت ئەوا خودا دەناسێت ، ناسینی خودیش بەوەیە کە بزانیت تۆ لەناودەچیت و نامێنیت بەڵام خودا دەمێنێتەوە ، بەم شێوەیە مرۆڤ بوونی نابێت لەبەردەم بوونی خودادا و بوونی مرۆڤ شــتێکی کاتی دەبێت لەبەرامبەر هەبوونی بێ کۆتای خودادا ، هەروەک چۆن خودا پێش دروســتکردنی گەردوون بەتەنها بوونی هەبووە ، لە دوای لەناوچوونی گەردوونیش هەر بوونی بەتەنها دەبێت و هیچ بونەوەرێک هاوشــــانی نامێنێتەوە گەورەیی و شکۆمەندی بۆ خودا ، بۆیە حەلاج کە بۆنمونە دەڵێت (من تۆم بەبێ شک و گومان) ئەوا واتا لەبەرامبەر تۆدا ئەی خودا منێک بوونی نیە و ئەوەی هەیە تەنها تۆیت و من دەسەڵات**

**و ئیرادەیەکم نییە بەبێ دەســـەڵات و ئیرادەی تۆ هەر بۆیە ئیرادە و دەســـەڵاتی خۆتە لەناو بونەوەرەکان کە شتێکت بتەوێت ڕووبدات یاخود ڕوونەدات**

## شیعری چل و حەوت : يا حبيبي أنت سؤلي قد تراني في مكاني

يا حبيبي أنتَ سؤلي قد تَراني في مَكاني

نورُكَ المُبصرُ حقاً لعياني لعياني

وتحققُّتُكَ فاصنعْ كُلَّ ما شئتَ بشاني

أنا في الحبّ قتيلٌ ومعَ الأحبابِ فاني

**ئەی خۆشەویست و دۆستەکەم تۆی مەبەست و ویستی من لەوانەیە لە هەموو شوێنێکمدا ببمبینیتەوە ، ڕووناکی تۆیە کە لە دیدە و چاومدایە ، ئەوەی تۆ دەتەوێت بەسەرمی بهێنە و من پێی ڕەزامەندم بۆیە بەجێی بهێنە ، من لە خۆشەویستیدا دەکوژرێم و لەگەڵ دۆست و خۆشەویستەکانم لەناودەچین و دەچینە فەناوە**

**شیعری چل و هەشت : طوبی لطرف فاز منک بنظرة أو نظرتين**

طوبى لطرْف فاز مِنكَ بنظرةٍ أو نظرتين

رأى جمالك كلّ يوْمِ مرّةً أو مرتين

يا زين كل مَلاحة حوشيت من عيب وشَيْن

أنت المقدم في الجمالِ فأين مثلك أين؟ أين ؟

خۆزگام بە چاوێک کە یەک یان دوو تێڕوانین تۆ بڕوانیتە چاوی ، یاخود لە ڕۆژێکدا جارێک

یان دوو جار جوانی تۆ ببینێت ، ئەی ئەوەی هەموو شتێکت جوانە و بەدووریت لە هەموو کەم

و کوڕیەک ، تۆ لەپێشەوەی جوانانیت ، هاوشێوەی جوانی تۆ لەکوێ هەیە ؟ لەکوێ ؟

**شیعری چل و نۆ : مزجت روحک في روحي كما**

**مُزِجَت روحُكَ في روحي كَما**

**تُمزَجُ الخَمرَةُ بِالماءِ الزُلالِ**

**فَإِذا مَسَّكَ شَيءٌ مَسَّني**

**فَإِذا أَنتَ أَنا في كُلِّ حالِ**

**ڕووحی تۆ تێکەڵ بە ڕووحم بووە وەک چۆن بۆنی خۆش تێکەڵ بە ئاوێکی ســارد و ســازگار دەبێت ، ئەگەر شتێک تووشی تۆ ببێت ئەوا توشی منیش دەبێت ، بۆیە لە هەموو حاڵەتێکدا تۆ منیت**

**شیعری پەنجا : دنيا تخادعني كأنني لست أعرف حالها**

دُنيا تُخادُعُني كَأَنني لَستُ أَعرِفُ حالَها

حَظَرَ الإِلَهُ حَرامَها وَأَنا اِجتَنَبتُ حَلالَها

مَدَّت إِلَيَّ يَمينَها فَرَدَدتُها وَشِمالَها

وَرَأَيتُها مُحتاجَةً فَوَهَبتُ جُملَتَها لَها

وَمَتى عَرَفتُ وِصالَها حَتّى أَخافَ مَلالَها

**دونیا وەها دەیەوێت هەڵم بخەڵەتێنێت وەک ئەوەی حاڵ و دۆخی نەناسـم و نەزانم ، خودا ڕێگری لە خواردنی حەرام و ڕێپێنەدراوەکـان دا ، بەڵام من تەنـانەت خۆم لە حەڵاڵ و ڕێپێدراوەکانیش بەدوور گرت ، دونیا دەستی ڕاستی بەرەو ڕووم درێژ کرد بەڵام من دەستی ڕاست و چەپیم گەڕاندەوە ، بینیم دونیا بووەتە خاوەن پێداویستی بۆیە هەموو شتێکم پێی دا ، کەی زانیم گەیشتن بە دونیا چۆنە ئەوکات خەمی دوورکەوتنەوە لێیم دەبێت**

## شیعری پەنجا و یەک : جبلت روحک في روحي کما

جبلتُ روحكَ في روحي كَما يُجبَلُ العَنبَرُ بِالمِسكِ الفَتِقِ

فَإِذا مَسَّكَ مَسَّني فَإِذا أَنتَ أَنا لا نَفتَرِق

**ڕوحت وەها تێکەڵ بە ڕووحم بووە وەک چۆن میسک و عەنبەر تێکەڵ بە یەکتر دەبن ، ئەگەر شتێکت بەسەر بێت ئەوا بەسەر من هاتووە ، بۆیە تۆ منیت و لەیەکتر جیا نابینەوە**

## شیعری پەنجا و دوو : مكانک من قلبي هو القلب كله

مَكانُكَ مِن قَلبي هُوَ القَلبُ كُلُّهُ

فَلَيسَ لِشَيءٍ فيهِ غَيرُكَ مَوضِعُ

وَحَطَّتكَ روحي بَينَ جِلدي وَأَعظُمي

فَكَيفَ تُراني إِن فَقَدتُكَ أَصنَعُ

**شوێن و پێگەی تۆ لەناو دڵمدا بریتیە لە هەموو دڵم ، جگە لە تۆ هیچ شتێکی تری تێدا نییە کە شـوێنی گرتبێت ، ڕوحم تۆی لەناو پێســت و ئێســک و پروســکمدا داناوە ، جا چۆنم دەبینیت دەبێ چی بکەم ئەگەر تۆ لەدەست بدەم ؟**

**شیعری پەنجا و سێ : هو إجتباني و أدناني و شرفني**

**هُوَ اِجتِباني وَأَدناني وَشَرَّفَني**

**وَالكُلّ بِالكُلِّ أَوصاني وَعَرَّفَني**

**لَم يَبقِ في القَلبِ وَالأَحشاءِ جارِحَةً**

**إِلّا وَأَعرِفُهُ فيها وَيَعرِفُني**

**ئەو منی بە شیاو دانا و لەخۆی نزیکی کردمەوە و پایەداری کردم ، هەموو شتێکمی بە هەموو شتێکم ناساند ، لە ناو دڵ و جەستەمدا شوێنێک نەماوە کە ئەو نەناسێت و ئەویش نەیناناسێت**

## شيعرى پەنجا و چوار : وجوده بي ، ووجودي به

وُجودُهُ بي ، وَوُجودي بِهِ وَوَصفُهُ فَهو لَهُ واصِفُ

لَولاهُ لَمْ أَعرِفْ رَشادِي وَلَوْ لايَ لَما كان لَهُ عارِفُ

فَكُلُ مَعنى فيِهِ مَعنى لَهُ فَقُلْ لِمَنْ خالَفَني : خَالِفوا

لَيسَ سِوَى الرَحمنِ يَا قوُمَنا شَيءٌ لَهُ ارواحُنَا تَأْلَفُ

**هەبوونی ئەو بە هەبوونی منە و هەبوونی منیش بە هەبوونی ئەوە ، و ستایشکردنی بەوەی کە ستایشە بۆی ، بەبێ ئەو من هۆشیار نەدەبوومەوە و بەبێ منیش کەسێک نەبوو بیناسێت ، هەموو مانایەک مانایە بۆ هەبوونی ئەو ، بڵێ بەوەی بەگوێم ناکات : بەگوێم مەکەن ، ئەی خەڵکینە جگە لە خودا هیچ شتێک نییە شایستەی ئەوەبێت ڕووحی خۆمانی لەپێناو بە فەنا و لەناوچوون ببەین**

# پێڕست

